بیروباوەڕی :

# أبو الفتح نصر بن إبراهيم المقدسي الشافعي

٤٩٠ هـ

وەرگێڕانی :

شاب السني

# بیروباوەڕی أبو الفتح المقدسي الشافعي

ناوی : نصر بن إبراهيم بن نصر بن إبراهيم بن داود بن أحمد النابلسي المقدسي الشافعي .

کونیەکەی : أبو الفتح .

لەدایکبووی : پێش ٤١٠ هـ

وەفاتی : ٤٩٠ هـ

## ستایش کردنی :

الذهبي ئەڵێ : فەقیهـ أبو الفتح ی زاهید، شێخی شافیعیەکان لە شام، وە خاوەنی چەندین دانراو .

## سەرچاوەی بیروباوڕ :

أبو الفتح المقدسي الشافعي ئەم بیروباوەڕەی خۆی باس کردووە لە کتێبەکەی (مختصر الحجة على تارك المحجة) دوای باسکردنی بیروباوەڕی ئەو پێشەوایانەی باسی کردوون .

أبو الفتح المقدسي الشافعي لە کتێبەکەی (مختصر الحجة على تارك المحجة) ئەڵێ :

١ - (ئەگەر کەسێک وتی باسی ئەوەت کرد کە واجبە لەسەر ئەهلی ئیسلام شوێنی کیتابی الله و سوننەتی رسول ەکەی ﷺ بکەون، وە ئەوەی پێشەوایان و زانایان کە ناسراون بە عیلم و دین لەسەری کۆبوونەتەوە، وە باسی ڕێگریت کرد لە بیدعەکان و ذەمی کەلام و ئەهواء ی دەرچوو لە حەق و ڕاستیت کرد، وە واجبێتی وازهێنان لەوە و دەست گرتن بەوەی ئەهلی سوننە و جەماعەی لەسەرن، باسی مەزهەبەکانیان و ئەوەی لەسەری کۆبوونەتەوە لە بیروباوەڕ بکە، وە ئەوەی پێویستە بڕۆین بۆی لە بیروباوەڕیان، بۆ ئەوەی بیزانین و بڕۆن بۆی و بیروباوەڕمان لەسەری دابمەزرێنین و پشتی پێ ببەستین .

لە وەڵامدا بە تەوفیقی الله عز وجل :

٢ - ئەوەی گەشتووم بە ئەهلی عیلم لەسەری، وە لێیانەوە وەرم گرتووە، وە لەوەی پێم گەشتووە لە وتەیان لە غەیری خۆیان لەوەی پشتی پێ ئەبەسترێت، وە لە کاتی پێویستیدا بۆی دەگەڕێتەوە، لەوەی قسە ئەکات بە عیلمی ڕاست، وە تێگەشتنی ناسراو، وە ئەمانەتی بەهێز، وە دینداری ئەصلی، ناسراو لەکاتی خۆیدا بە ئیمامەتی، وەصف کراو بە

پێشەوا و گەورە، قسەکەر لە کیتاب و سوننەت و ئیجماعی زانایانی ئوممەت، دوور لە بیدعە و گومڕایی و ئەهواء و نەزانی کە :

٣ - بیروباوەڕ درووست نیە مادام ئەصلێکی نەبێت لە کیتابی الله تعالی، وە لە سوننەتی رسول ـەکەی ﷺ، وە لە ئیجماعی ئەهلی عیلم لە هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان بە چاکە ڕازی بوون و ڕەحمەتیان لەسەر بێت لەلایەن الله ی الرحمن، الکلام حەڵاڵ نیە تێیدا، وە ئەوە بیدعەیەکی گومڕاییە، وە سەرپێچی و نەزانییە .

---

: الکلام ئەوەیە کە تەواوی فیرەقە جەهمیەکان عەقیدەی خۆیانیان لەسەر بنیادناوە، وە لە پێناویدا وتەی الله عزوجل ورسول الله ڕەتئەکەنەوە ﷺ .

ئەم بەشە ڕەددە بۆ ئەو هەموو بیدعەچیانەی کە چەندین بیدعەیان داهێناوە کە لە قورئان و فەرموودە و ئاثاری سەلەفدا بوونی نییە .

لێرەوە هەڵوێستی سەلەف رحمهم الله بەرامبەر الکلام و ئەهلەکەی بزانە :

https://t.me/Ktebxanay_salaf1/444

٤ - دواتر باوەڕ بوون بەوەی الله تعالی تاکە، تەنهایە، کەسی لێ نەبووە و لە کەسیش نەبووە، وە هیچ شتێک هاوشێوەی نیە، وە عالەمی درووست کردووە، وە پێغەمبەران و نێردراوانی ناردووە، وە کتێبەکانی دابەزاندووە،

وە شەریعەتی بۆ درووستکراوەکانی داناوە، وە فەرمانی پێکردوون و ڕێگری لێکردوون، وە ئەو هەموویان ئەمرێنێت، دواتر زیندوویان ئەکاتەوە بۆ ڕۆژی قیامەت، لێیان ئەپرسێتەوە لەوەی پێش خۆیان کردوویانە، وە ئەیهێنێتەوە ڕێیان لەوەی پێشیان خستووە و دوایان خستووە.

**٥** - وە ئەوەی کتێبەکانی درکاندوویانە ئەوە حەقە، وە ئەوەی نێردراوەکانی هەواڵیان دەربارەی داوە ڕاستە، وە بۆ هیچ کەس درووست نیە پێچەوانەی فەرمانی بکات و لێی لابدات .

**٦** - وەصف ئەکرێت بەوەی خۆی وەصفی خۆی پێکردووە لە کیتابەکەی، وە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ، لەوە لانادەین و لێی زیاد ناکەین، وە غەیری ئەوە قیاس ناکەینە سەری بە عەقڵمان، بەڵکو تەسلیمی ئەبین بەوە، وە تەوەکول ئەخەینە سەری بۆ تەوفیق دانمان .

---

**: ئەوەی کە نووسەر باسی کرد عەقیدەی سەلەفە رحمهم الله، وە عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعەیە لە هەموو سەردەم و شوێنێکدا، ئەویش بریتیە لە ناسینی الله عز وجل بەو شێوەیەی کە خۆی وەسفی خۆیی پێ کردووە، وە بەو شێوەیەی پێغەمبەرەکەی ﷺ وەسفی پێکردووە، ئەو دوو انەش بە تێگەیشتن و ئاثارەکانی سەلەفی ئوممەت، کە تێیدا سیفاتەکانی الله عز وجل یان جێگیرکردووە لەسەر رووکەشی ئەوەی لە قورئان و فەرمووددەدا هاتووە، وە تکییف و تشبیه و تعطیل و تحریف و تمثیل یان نەکردووە .**

**بەڵام ئەهلی الکلام لەعنەتی الله عز وجل یان لێبێت هاتن لەڕێگەی ئەو یاسا کەلامیانەی کە لە فەلسەفەی یۆنان و هیند و ئیغریق ەوە وەرگیراوە ویستیان الله عز وجل بناسن، لەبەر ئەوەی ڕووکەش و مانای حەقیقی وتەی الله عز وجل و پێغەمبەرەکەیان بە کوفر و تەشبیه ئەزانی، هەربۆیە کەوتنە ناو چەندین کوفر کە یەهودی و نەصرانیەکان تێی نەکەوتن .**

٧ - وە ئیمان وتە و باوەڕ و کردارە، زیاد ئەبێت بە گوێڕایەڵی، وە کەم ئەکات بە سەرپێچی .

---

**: ئەمە ڕەددە بۆ مورجیئە گومڕا و بیدعەچیەکان، کە پێیان وایە کردەوە بەشێک نییە لە ئیمان، وە ئیمان زیاد ناکات بە ئەنجامدانی کردەوەی باش، وە کەم ناکات بە ئەنجامدانی کردەوەی خراپ .**

٨ - وە قورئان کەلامی الله یە عز وجل، وەحی ئەوە و دابەزێندراویەتی غەیر مەخلوقە، هەرچۆن تیلاوە بکرێت و بخوێندرێتەوە و بنوسرێت .

---

**: ڕەددە بۆ هەموو جەهمیەکان، وە بە تایبەتی ئەشعەریە جەهمیە لەفظیەکان کە پێیان وایە قورئان بە خوێندراوەیی و نووسراوی ئەبێت بە مخلوق، ئەمەش عەقیدەیەکی کوفریە، چونکە قورئان لە هەموو کاتێک و بە هەموو شێوازو لە هەموو حاڵەتێکدا غیر مخلوق ە .**

**٩** - وە قەدەر خێر و شەڕی، تاڵ و شیرینی لە اللە وەیە عز وجل :

هەموو کردەوەی بەندەکانی بە قەدەر داناوە وە بۆی بڕیار داون پێش ئەوەی کردەوەکانیشیان درووست بکات، ئەوان ئەوە ئەنجام ئەدەن کە بۆیان دانراوە و بڕیار دراوە و نوسراوە و تێپەڕیوە، لەو قەدەرە لانادەن، لە ڕیزبەندییەکەی جیا نابنەوە، وە دەرناچن لە عیلمەکەی، وە لانادەن لە حوکمەکەی .

---

**: هەموو شتێک کە ڕووئەدات بە قەدەری اللە عزوجل ە، واتە اللە عزوجل زانیویەتی کە ئەو شتە ڕووئەدات، وە ویستی لەسەری بووە کە ڕووبدات، وە نووسویەتی لە ڕووبدات، پاشان کردارەکەشی دروست کردووە .**

**١٠** - باشترینی ئەم ئوممەتە دوای پێغەمبەرەکەی ﷺ : أبو بکر الصدیق دواتر عمر بن الخطاب دواتر عثمان بن عفان دواتر علي بن أبي طالب اللە لە هەموویان ڕازی بێت .

وە ئەوانە خەلیفەکانی ڕێنیشاندەر و هیدایەت دەرانن کە رسول اللە ﷺ فەرمانی کردووە بە شوێنکەوتنیان، وە ڕێگری کردووە لە پێچەوانە کردنیان .

١١ - وە ئەو دە کەسەی رسول الله ﷺ شاهیدی بۆ داون بە بەهەشت لەوەی شاهیدی بۆ داوە، وە بەهەمان شێوە جگە لەوانیش لەوەی هەواڵی دراوە بەوە [بە بەهەشت] یان بەڵێنی پێدراوە لەسەر ئەو کارەی ئەیکات بە بەهەشت.

١٢ - وە ڕەحمەت ناردن بۆسەر هەموو هاوەڵانی رسول الله ﷺ، وە بڵاوکردنەوەی فەزڵەکانیان، وە وازهێنان لە ڕۆچوون تیایانا [بە خراپە] وە خۆگرتنەوە لەوەی ڕوویداوە لە نێوانیان.

١٣ - وە الله تعالى استواء ی کردووە لەسەر عەرشەکەی [استواء بە مانای بڵندێتی و جێگیربوون و بەرزبوونەوە و سەرکەوتن و دانیشتن دێت لە زمانی عەرەبی بۆیە لای ئەهلی سوننەش وەک بیروباوەڕ دامەزراوە]، جیایە لە درووستکراوەکانی، وەک چۆن لە الكتاب العزيز الحكيم [واتە قورئان] ئەفەرمووێ، عیلمەکەی دەوری هەموو شتێکی گرتووە، وە سەرژمێری هەموو شتێکی کردووە، ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ (الشورى : ١١).

---

: ئەو ئایەتە دەربارەی تەوحید ئەدوێت، هەر ئایەتێک باسی تەوحید بکات ئەوە وەک لا إله إلا الله لە دوو بەش پێکدێت ئەوانیش نەفی کردن - نفي - و جێگیرکردن - إثبات - ن.

بۆ نمونە ئایەتی : | فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ | (البقرة : ٢٥٦) لە نفي و إثبات پێکدێت، ئەگەرکافرببیت بە طاغوت بەڵام ئیمانت بە الله عزوجل نەبێت ئەوا تەوحیدەکەت دانەمەزراوە، وە ئەگەرئیمانت بە الله عزوجل هەبێت بەڵام کافرنەبیت بە طاغوت ئەوا بەهەمان شێوە تەوحیدەکەت دانەمەزراوە، بەڵکو ئەبێت نەفی هەموو طاغوتێک بکەیت و پەرستراوێتی الله عز وجل جێگیر بکەیت ئەمجا تەوحیدەکەت دامەزراوە و پێت ئەوترێ موسڵمانێکی حەقیقی، ئەم ئایەتەش کە هێناوێتی نەفی چۆنێتی بۆ دانان و هاوشێوە دانان بۆ الله عزوجل ئەکات کە ڕەددی موشەبیهە و موجەسیمە و ڕافیزە و حلولیە کافرەکانی تیایە، وە صیفەتی بیستن و بینین وەک عومدەیەک بۆ باقی صیفەتەکانی تر بۆ الله عز وجل جێگیر ئەکات کە ڕەددی جەهمی و موعتەزیلی و کوللابی و ئەشعەری و ماتوریدیە کافرەکانی تیایە، بۆیە ئاگادار بە تا نەفی هاوشێوە و چۆنێتی بۆ الله عزوجل نەکەیت وە صیفەتەکان بۆ الله عزوجل جێگیر نەکەیت ئەوا تەوحیدەکەت دانەمەزراوە و موسڵمان نیت و غەیری الله ت پەرستووە سبحانە وتعالی! وە ناشبێت دۆستایەتی کەسێک بکەیت کە یەکێک لەو دوو انەی نەبێت - نفي و إثبات - بۆ نمونە بڵێی مادام الله عزوجل ئەپەرستێت ئیتر حەقم بەسەریەوە نیە هەرچەندە کافریش نەبووە بە طاغوت، یان بڵێی مادام الله عز وجل ناشوبهێنێ بە هیچ شتێک ئەوا حەقم بەسەریەوە نیە هەرچەندە صیفەتەکانیش بۆ الله عزوجل جێگیرناکات .

١٤ - وە الله تعالی ئەبینرێت لە ڕۆژی دواییدا، ئیمانداران بە چاوەکانیان ئەیبینن، وە کافران لە بینینی داپۆشراون .

**: الله عزوجل هەموو موسوڵمانێک بێبەش نەکات لە بینینی خۆی کە باوەڕیان بەو ئایەت و فەرموودەیانە هێناوە کە باسی بینینێکی حەقیقی الله عزوجل ئەکەن، وە هەموو ئەو جەهمی و ئەشعەری و موعتەزیلە و ماتوریدیانە بێبەش بکات کە کافرن بە بینینی حەقیقی الله عزوجل، آمین .**

**١٥** - وە بەهەشت حەقە، وە ئاگر حەقە، وە ئەو دووانە دروستکراون و هەرگیز لەناو ناچن .

**١٦** - وە میزان حەقە .

**١٧** - وە صیراط حەقە .

**١٨** - وە حەوز کە پێغەمبەرمان ﷺ ڕێزدار کراوە پێوە حەقە.

**١٩** - وە شەفاعەت حەقە، وە خەڵکانێک لە ئەهلی تەوحید دەرئەکرێن لە ئاگر وە تیایدا نامێنێتەوە کەسێک کە لە دڵیدا شتێک لە ئیمانی تیا بێت **[ئەگەر بەقەد گەردیلەیەکیش بێت]** .

**٢٠** - وە سزای ناوگۆڕ حەقە .

**٢١** - وە منکر و نکیر حەقە .

**٢٢** - وە نووسەرانی بەڕێز **[ئەو فریشتانەی کاروباری بەندەکان ئەنووسن]** حەقە .

**٢٣** - وە ئەهلی تاوانە گەورەکان لەژێر ویستی الله دان، هیچ کەسێک لە ئەهلی قیبلە بە تاوان کافر ناکەین، بەڵکو حوکم ئەدەین بەسەریاندا بە ئیمانیان و حوکمەکانیان و میراتەکانیان، وە نهێنیەکانیان ئەبەینەوە بۆ لای الله تعالی .

**٢٤** - وە وای ئەبینین حەج و عومرە و جیهاد و جومعە و نوێژەکان و سەرجەم گوێڕایەڵیەکان لەگەڵ پێشەوای موسڵمانان بەردەوامە تا ڕۆژی قیامەت .

**٢٥** - وە گوێڕایەڵی بۆ کاربەدەستان لە گوێڕایەڵی الله جگە سەرپێچیەکەی [تەنها تا ئەو کاتەی فەرمان بکەن بە گوێڕایەڵی الله ئەمجا گوێڕایەڵیان ئەکەین] .

ئەمە ئەوەیە کە پێیان گەشتووم لەسەری و پێم گەشتووە لێیانەوە ڕەحمەتی الله یان تبارك وتعالی لێ بێت، وە تەوفیقی ئێمە و ئێوەش بدات بۆ ئەوەی پێی ڕازیە، وە کاروکردەوە بکەین لەوەی ئەو خۆشی ئەوێت و پێی ڕازیە، ئێمە بە ئەوەوەین و بۆ لای ئەو ئەڕۆین .

لینکی عەقیدەکە بە عەرەبی :

**https://t.me/jami3mutun/62**